نۆلکلۆر

# مەیل مەیلانێی کوردەواری





کۆکردنەوەو ئامادەکردنی
فەرهاد گۆمەشینی

چاپی دووەم
٢٠٠٥

فۆلکلۆر

# (مەیل مەیلانێ)ی کوردەواری

کۆکردنەوەو ئامادەکردنی

فەرهاد گۆمەشینی


چاپی دووەم

٢٠٠٥

ناوی کتێب : مەیل مەیلانێی کوردەواری
ئامادەکار : فەرهاد گۆمەشینی
تیراژ : ٣٠٠ دانە
پیت چنین : نوسینگەی کۆمپیوتەری ڤان (سالار گۆمەشینی)
دیزاین : سۆران / چاپخانەی شەهاب
وێنەی بەرگ : مامۆستا جەلیل
ژمارەی سپاردن : ٩٠ ساڵی ٢٠٠٥
ژمارەی چاپ : دووەم

لە چاپخانەی شەهاب لە هەولێر لە چاپ دراوە

## سەرەتا:

بۆ زیاتر خزمەت کردن بە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی و دەوڵەمەند کردنی زمانەکەمان، ئەم چەپکە مەتەڵەم کۆ کردیتەوە، هەر لە ساڵی حەفتاکانەوە تاکو ئێستا ئەیکەمە دیاری بۆ گەلی کورد زمان. مەتەڵیش بەشێکە لە ئەدەبی فۆلکلۆر، کورد هەر وەك لە بەشەکانی تری ئەدەبی فۆلکلۆری دەوڵەمەندە، وەك: (چیرۆك، پەند، هۆنراوە، ئەفسانە، هتد) هەر ئاواش لە مەتەڵدا بێبەش نەبووە، هەرچەندە لە بواری مەتەڵدا کەم بابەت ترە.

پێناسەیەك بۆ ووشەی (مەیل، مەتەڵ):

ئەم ووشەیەلەزمانی کوردیدا چەند ناوێکی بۆ بەکار دێنن، بە پێی ناوچەکان، لە کۆیەو هەولێر و دەوروبەری ووشەی (مەیل) ی بۆ بەکار دێنن لە خۆشناوەتیدا (هەتتەر)ی بۆ بەکار دێنن یاخود (هەتەرۆك). لە سلێمانی و بەشێکی ئەو دیوی ئێران (مەتەڵ ) ی بۆ بەکار دێنن. لە زۆر ناوچەی بادینان (مامك) ی پێ دەڵێن... هتد.

(مەیل) بریتیە لە چەند ووشەیەك یان چەند رستەیەکی ماناداری پرسیار ئامێز، لە کەسێکی تاکەوە ئاراستەی کەسێك یاخود چەند کەسێك دەکرێت، بۆ ووروژاندن و زاخاودانی مێشك، یاخود ئاشنا کردن و ناساندنی شتەکانی دەوروبەر .

(مەیل) بە مانای (مەبەست) یاخود نیاز دێت، کە ئەڵێیت مەیلێکم هەیە واتە: مەبەستێکم هەیە. ئەڵێی من مەبەستێکم هەیە ئایا ئێوە دەتوانن مەبەستەکەم بزانن؟! یاخود نا؟ .

بۆ نموونە ئەم مەتەڵە ئەهێنمەوە، دەڵێ: (مەیلەکم هەیە مەیلانی، نە پێی هەیە نەپانی، بە هەموو مالان دەزانی) . لێرەدا مەتەڵ زان سەرەنجی

گوێگرەکان بۆ لای خۆی رادەکێشی کە مەبەستی لە شتێکە بۆ خۆی دەچێتە سەربانی ، گوێرەکان سەرەتا بیریان بۆ لای مرۆڤ دەچێ، بەلام مرۆڤی بێ قاچ ناتوانێ بۆ خۆی بچێتە سەر بان مەگەر بە هاوکاری کەسانی تر . ناچار بە دوای شتێکی گونجاو دەگەرێن . مەگەر کەسێکی وورد بین لە ناویان هەڵی بینێ دەنا لە دواجاردا مەتەڵ زان بۆیان ئاشکرا دەکات، مەبەستی (دوکەڵ)ـە.

(مەیل) مەتەڵ، لە شێوەی چەند ووشەیەکی سادە یاخود چەند رستەیەکی سادە، یاخود لە شێوەی هۆنراوەدا ، لە هۆنراوەیەکی بە کێش و سەروا، یاخود لە چوارین و پێنج خشتەکی یاخود لە دێرو نیوە دێر... هتد... دەخرێتە روو.

باب و باپیرانی ئێمە (مەیل) یان بە کار هێناوە، هەم بۆ زاخاودانی مێشکی رۆڵەکانیان و هەم بۆ پێناسە کردنی شتەکانی دەورو بەر بۆ رۆڵەکانیان، هەم بۆ جۆش دان و گەرم و گوڕ کردنی کۆرو مەجلیسەکانیان چ لە دیوەخانەکانیان یاخود شەوانە لە ماڵەکاندا، بۆ دوور کەوتنەوەش لە گوناهی زەم و زەمکاری ئەم و ئەو. هەم کەلەپورێکی پڕ بایەخیان بۆ ئێمە بە جێ هێشتووە، کە پڕە لە ووشەی زێرینی کوردی، بۆ دەوڵەمەند کردنی زمانەکەمان.

باب و باپیرانمان بە هۆی ئەو (مەیل و مەتەلانەی گتویانە، ئێمە دەتوانین لەم رێگەیەوە ژیان و مەینەتی‌یەکانیان بخوێنینەوەو پێناسەی بکەین، بە هۆی ئەو کارو پیشەو کەل و پەلانەی لە ژیانیاندا بە کاریان هێناوە بۆ نموونە: پیاوان کاری قورسیان ئەنجام داوە وەك: (جووت کردن بە ولاغ و دروێنە کردن بە داس و قەیناغ، پاك کردنەوەو کۆ کردنەوەی بەرو بوومی، کشت و کاڵی، بە تایبەت گەنم و جۆ، وە کێشانەوەی بەرهەمەکە، بە ولاغ، وە گێرەی بە جەنجەڕو شەنەبا کردن، بۆ جیاکردنەوەی کاو کۆت لە بەرو بومەکە، وە کێشانەوەی کایەکە بە ولاغ و رەشکەو کێشانەوەی بەرهەمەکەی تر، بە جواڵ و خرار بە

ولاغ، جگە لە مەینەتی ترو گەرماو ماندی بوونی هێجگار زۆر، ئەمەش بە هۆی نەبوونی (دەڕاسەو تەرەکتۆر و لۆری و... هتد)

وە هەروەها کارو پیشەکانیتریش هەر بەم شێوەیە و بەم چەرمەسەرییە، جگە لەوەی کاتێکی زۆریان لە کیس دەچوو بۆ بەرهەم هێنانی بەرهەمەکانیان، جگە لەوەی نەیان دەتوانی، ەویەکی زۆر دابچێنن و بەرهەمی زۆرتر بەدەست بێنن ...بە تایبەت ئەو کەسانەی کەم خێزان و کەم دەست بوون ، یاخود نەخۆش بوون و توانای کار کردنیان نەبوو، بۆیە زۆریەی زەویەکانیان دەمانەوەو دانەدەچێنران، لە هەمان کات ئافرەتاکانیش بێ بەش نەبوون لە چەرمەسەریەکان ، وەك لە ( ئاو هێنان لە کانی و بیرو ڕووبارەکان، بە مەنجەڵ و تەنەکە، یاخود دۆشینی ئاژەڵ و مەشکە هەژاندن و لێکردنی زەخیرە، بە دەستاڕو ئاون و، هێنانی دارو پوش و سەرگین لە دەشت و دەر ، وە بەکار هێنانی بۆ نان کردن لە جیاتی نەوت و غاز مەتەڵیش زۆرە کە ئیشارە بەو کارانە بدات کە پیاوی کورد کردویانە یاخود ئافرەتی کورد کردوویانە ، بۆ نموونە :-

١- (مەیلەکم هەیە لە دەشتێ ، حەفسەد کونی لە پشتێ ) واتە : ڕەشکەی کاکێشان.

یاخود ( گەردەن کۆترێ ، لەناو دەغران دەکا لۆندرێ ) واتە (داس ) هتد ...ئەمەش ئیشارە پێ کردنە لەوەی بە داس دەغڵ و دانیان دووریتەوە ، وە کایەکەیان بە ڕەشکەو ولاغ کێشاوەتەو ال . هەرچەند ئافرەتانیش لەم جۆرە کارانەدا بەشدار بووینە ، وەکاری تریشیان ئەنجام داوە وەك (مەلۆ کێشان ، درونەی نۆك و نیسك و بژارکردن و هتد ...وە ئافرەتان لە ماڵەوەش کاری تریان زۆر ئەنجام داوە، تایبەت بە خۆیان، وەك : دەستاڕ لێکردن و ئاون و جۆنی بۆ کوتانەوەی هەندێك لە زەخیرەی ماڵ ، وە تەشی ڕێسی و ئاو هێنان و مەشکە هەژاندن و خزمەت کردنی ئاژەڵ ، جگە لە بە خێو کردنی منداڵ و چێشت لێنان و کۆڵ کردن و هتد ..وەك هەندێك لەم مەتەڵانە ئیشارە بەو

کارانـەیان دەدەن ، بۆ نموونە : ( مەیلەکم هەیە مەیلانی ، نە پیّی هەیە نەپانی ، بە هەموو مالآن دەزانی ) واتە ( دەستاڕ)

٢- (هەڵمـەت دەبـا لـۆ پێشـیّ ، دەو بەشـە ددانـی نیـیە بیکێشیّ ) واتە ( مەشکە لە کاتی ژەنینیدا )

٣- ( کەری رەش کورتانی سپی ) واتە ( سیلّ و نان کردن)

ئەمانـەی سـەرەوە چـەند وێـنەیەکە لەکارکـردنی پـیاوان و ژنـان، لـە دەرەوەی مالّ و لە ناو مالّدا، بە کورتی باسمان لێوە کردن .

نموونـە لـە چـەند مەتەلّێك دەهێنـنەوە، کـە باس لە خانوو ناو مالّی کورد دەکـات لـەو سـەردەمیدا ، وەك ( هـەری دەی چیایە ، دای بنیّی گایە ) واتە ( رەشمـالّ ) وە ئـەو کاتـە زۆر مـالّ رەشمالّیان هـەڵداوە ، ئەگـەر هەندێکیان لـە زستانیش بـەکاریان نەهێنابیّ لە هاوین بەکاریان هێناوە ، وە کەسێکیش ئەگەر رەشمـالّی نـەبیّ لـە خانووی کوخ دابووە ، یاخود لە بەهارو هاوینان لە نیو کەپر دابـووە . بەکاریان هێناوە لە هاوینەهەواردا ، بەتایبەت مەڕدارو کۆچەریەکان لە چـوار وەرزی سـالّ بـەکاریان دەهێـنا ، ئەمـە خانوو بەرەیەك بووە ، هەرچەندە بەشـێکی زۆریـش گوندنشـینەکان زسـتانە هـەواریان هـەبووە و گوندەکانـیان ئـاوەدان بـووە ، خـانوی بە (خشتی قوڕ ) یان هەبووە ، یاخود بە (بەردو قوڕ ) دروستیان کردووە

٤- (نـەدارە نـەدیوارە ، بـەنی هەوسارە ) واتە (چیخ) بە قامیش و مووی بـزن دروسـتیان دەکـرد و دەیـان هۆنیـیەوە ، ئەمەش لە جیاتی دیوار بەکاریان دەهێـنا لـە دەوری کەپـرو رەشمـالّ ، یـاخود ( هەوێـزی ئـاژەلّ ) یـان دیـواری حەوشە ، هتد ...

بـە نسـبەت ناومالّـیش کۆمەلّێك کـەل و پەلـیان بـەکار دەهێـنا، وەك لـەم مەتەلآنەی خوارەوە وێنەیان بۆ کێشراوە و بۆمان باس دەکەن ، وەك:

١-(چواری پیّیە، هەشتی گوێیە، باری حوشترەکی لێیە) واتە (هەرزارە) لـە جـیاتی کەنـتۆر یـاخود (کەوەنـتەر)ی ئێسـتا بەکاریان دەهێنا. بریتی بوو لە

چوار داری دوو گۆیێ، یەك مەتری یاخود زیاتر دەیان چەقاند بەرامبەر بەیەك ، وە چەند دارێکی تریان لە سەر رایەڵ دەکرد و ( زەخیرە )یان (نوێنیان ) لە سەر دادەنا . ئەمە دیمەنێك بوو لە ژوورەوە و ژوورەکەی دەڕازاندەوە .

٢-(هەندوکە بە دندوکە لە پێش حاکمان دەڵێی بوکە ) واتە (چرا رەشکە ) یاخود (چرا ) چرا بریتی بوو لە قوتویەکی بچوکی بەسەر، فتیلێکیان لەسەری چەسپ دەکرد، واتە سەری قوتوەکەیان درز دەکردو فتیلێکیان پێدا شۆڕ دەکردەوە ، بە نەوت کاریان پێ دەکرد ، چرایەکە هەندێك (روناکی و دەکەڵی ) بە ژوورەکە دەبەخشتی ئەندامانی خێزانەکە بەیانی کاتی لەخەو هەڵدەستان لوتیان لە گەڵ قورگیان پڕ بووبوو لە دوکەڵی رەشی پیس ، ئەمە لە جیاتی ( فانوس و گلۆپ و لامپا ) بەکار دەهات .

٣-(رەشێ لە نساری هەردەداتە کابانی ) واتە (هێزە ) هێزە جۆرە گۆزەیەکە، کە رۆنیان تێ دەکرد ، لە (ناندین ) دادەنرا ، کابان بۆ چێشت روونی لێ دەردەهێنا ، لە جیاتی تەنەکەی روونی ئێستا ، ئەمەش دیمەنێك بوو لە نێو (ناندین ).

٤-(نەبایە نەباران چك چکەی درۆپان) واتە (کوندەلآن ) کوندەلآن بریتی بوو لە چوار داری دوو گویێ مەتری دەیان چەقاند، چەند داریان لە سەر رایەڵ دەکرد و پاشان هەندێك (پوش) یاخود (چرو ) یاخود شتێکی تری لەم بابەتەیان لەسەر فەرش دەکرد ئەمە لە حەوشە لەشوێنێکی بەر سێبەر دروست دەکرا (کوندەو دۆدانە) یان لەسەر دادەنا بۆ سارد بوون، جار وابوو چێشتی ماوەو مەنجەڵە ماست.... و هتد، لەسەریان دادەنا بۆ پاراستن لە گەرماو پیسی ، ئەم کوندەلآنە لە جیاتی سەلاجەو مجەمیدەو ئاو ساردکەرەوە بەکاریان دەهێنا .

٥-بە سێ برایان مێزەرەك ) واتە ( سێپێك) سێ پێك بریتی بوو لە سێ داری درێژی ( ٣) مەتری لای سەرەوەیان بەیەکەوە دەبەست بە گوریسێك یاخود کەژیەك ، یاخود شتێکی تر لای خوارەوەیان لە یەکتری جیا دەکردەوە

، ئافرەتان مەشکەیان لێی چەسپ دەکردو مەشکەیان دە هەژاند لەوەوە دۆیان دروست دەکرد ئەمەش دیمەنێکی تری حەوشەی کوردەواری بوو ، شوێنی لە حەوشە یاخود لە پیش کەپر یاخود پێش رەشماڵ بوو .

وە کۆمەڵێکیش (مەتەڵ) هەیە لە رووی بیرو بڕواو ئاینەوە ، وەك ئەم نمونانەی خوارەوە : –

١-(میحرابی گۆشتە ، مزگەوتی ئاوە ، روو لەهەر لابكات قیبلەی تەواوە ) واتە: (حەزرەتی یونس) لەم کاتەی لە ناو سگی ماسی دا بوو ) درودو سەلامی خوای لێ بێت.

٢-(مەیلەکم هەیە مەیلانێ ، حەوت پیتە ئەگەر بیزانی ، هەڵم دەستێنی لە بەیان ، خودام لێ ناکا نیگەران ) واتە: کەڵەشێر .

کاتی نوێژی بەیانی مرۆڤەکان لە خەودان ، پێویستە بێدار بکرێنەوە، بۆ ئەوەی هەڵسن بۆ بەجێ گەیاندنی نوێژی بەیانی ، بەتایبەت ئەو گوندو هەوارگانەی مزگەوتیان لێ نییە ، تا خەڵکەکە بۆ نوێژ بێدار بکرێنەوە یاخود ئەو گوندانەی مزگەوتەکانیان مایکرۆی لێ نییە ، یاخود ئەو ماڵانەی دوورن لە مزگەوت و بەبانگی مزگەوت بێدار نابنەوە ، جا شتێکی تر هەیە لە ناو ماڵەکان ، مرۆڤەکان لە خەو بێدار دەکاتەوە بۆ هەڵسان لە خەو بۆ ئەنجام دانی نوێژی بەیانی. ئەویش (کەڵەشێرە) وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە فەرمودەیەکیدا دەفەرموێت (لا تسبوا الدیك فانه یوقظ للصلاة) رواه (ابو داود) وقال صحیح.

واتە: جنێو بە کەڵەشێر مەدەن، چونکە بێدار کەرەوەی نوێژە.

٣-(برێنە ئاقر تەواوێ، سێی لە سێبەرێ، دووی لە هەتاوێ) واتە پێنج نوێژە فەرزەکانی لە شەوو رۆژدا ئەنجام دەدرێن، کە (مەغریب و عیشاو بەیانی) لە شەو ئەنجام دەدرێن و (نیوەڕۆو عەسریش) لە رۆژدا ئەنجام دەدرین.

وە هەندێك مەتەڵ هەیە، وەڵامەکەی لە نێو خۆیدایەو ئاسانە، مەتەڵزان تەنها بۆ ئەوەیەتی گوێ گرەکانی بە هەڵە ببات و لێیان تێك بدات ، بۆ تاقی کردنەوەی ئاستی ژیریان، بزانی تا چ رادەیەك توانایان هەیە.

بۆ نموونە وەك ئەمانەی خوارەوە:

١-(كانۆكانە كانۆكانە، هەرچی نەیزانی نەزانە) واتە (كانۆك) كای نۆك.

٢-(سەری سپی‌یەو ناوی شیرینە) واتە: پیرەژنێكی سەر سپی ناو شیرین.

مەتەڵ چەند جۆرو لایەنی تری هەیە لە بارەی شتەكانی تر دواون، وە سوودی زۆرمان لە مەتەڵ دەست كەوتووە، بە تایبەت لە رووی فەرهەنگ و زمانەوانی‌یەوە، كە پڕە لە ووشەی كوردی رەسەن.

جۆرێكی تر لە مەتەڵ هەیە، زیاتر بۆ زمان رەوانی‌یە نەك بۆ زاخاوی میشك وەك ئەو نموونەی خوارەوە:

(ئاشی سوسیێ، سوتا بە شەوی سێ شەم) بە پەلە سێ جار ئەم ووشانە دووبارە بكرێنەوە، بێ ئەوەی غەڵەت بكات.

هیوادارم خزمەتێكی بچوكی ئەدەبی فۆلكلۆری كوردیم كردبێ.

## پیتی (أ)

- ئاسنی بەیبونێ
  داوێمە پشت ستونێ

*پێمەڕە*

- ئاخوڕی خوارە
  گای هارە

*خەنجەر*

- ئاسنی سەر زەق
  لە سەر تەختی رەق
  بە دارێکی رەق
  دەکاتن لەقە لەق

*تەشی*

- ئەشتەکم هەیە
  پڕ تەپشولەیە

*دەم و ددان*

- ئێشت پێی بێ فڕێی دەدەی
  ئێشت پێی نەبێ هەڵی دەگری

*تۆڕی ڕاو*

- ئــــــــەم لام دیــــــــوار
ئــــــــەولام دیــــــــوار
تێـــــیدا ســـــەگێکی هـــــار

زمان

- ئەشــــــــــــــــــکەوتۆکە
پـــــــــڕ بەردۆکــــــــــە

دەم و ددان

- ئـەوە چـی‌یە ؟ چی پـێ دەڵـێن
تـــارا زەردی پـــێ دەڵـــێن
پەپکـە بـە کونجـی پـێ دەڵـێن

هەنجیر

- ئـەوە چـی‌یە ؟ چی پـێ دەڵـێن
عـــەبا نـــارنجی پـــێ دەڵـــێن
پەپکـە بـە کونجـی پـێ دەڵـێن

تەماتە

■ ئــــەوە چـــــی‌یە؟ چـــیایە
لەســــــەر چـــیای گـــــیایە
لــــە ســــەر گـــیای چـــرایە

(قەنتەی ا جگەرە
کێشتان)

■ ئەوە چی‌یە؟ لە هەموو شوێنیّ
بـــــۆ مـــــرۆڤ زۆر پـێـوسـتـە

ژیری

■ ئــەم لای شــاخ و ئــەو لای شــاخ
پــی‌ی دادێـت چورچــەی پــەیداخ

کیسەڵ

■ ئــەو لای کەڵــەك، ئــەو لای کەڵەك
لەناوەڕاســـتی چـــەرخ و فەلــــەك

دەم و زمان

■ ئــەرزی ســپی، بــە جـۆ دەکــەم
بــــــــەدەم، دەی چـــــــێنم
بــــــە دەســــــــت دەی دورم

پێنوس و کاغەز

- ئـاوی پـێ داکـەی، تـەڕ نـابێ
  خەنجـەری لێ دەی، کـون نـابێ

(سێبەر)

- ئەگـــەر تـــەواوە ناتـــەواوە
  ئەگـــەر ناتـــەواوە تـــەواوە

(مانگ لە ٣٠ و لە ١٤)

- ئەسپەکەم دووپێیە
  بێ سوار، ناچێتە ڕێیە
  خواردنی نییەو بێ گێیە

(پایسکیل)



گوندی گۆمەشین ٢٠٠٤

# پیتی (ب)

- بــە ســـێ بــرایان مــێزەرەك

  (سێ پێک)

- بـــە پیســـــی دەخـــــورێ
  بـــە خاوێـــــنی نـــاخورێ

  (لاشەی مرۆڤ و گیان لەبەر)

- بەشـــــــەو مەیمونـــــــە
  بـــــــە رۆژ خاتونـــــــە

  (ئەستێرکە) نوێن)

- بەقــــــەد پولـــــــێکە
  پــــڕ بـــــە ژورێکـــــە

  (گلۆپ)

- بـــــە رۆژ دەڕازێـــــــتەوە
  بـــە شــــەو دەڕوتێـــتەوە

  (ئەستێرکە) نوێن)

- بەقــــــەد هەنارێکـــــــە
  پڕبەماڵـــــــــــــــێکە

  (گلۆپ)

- بەرخۆکـــــەی ســــەر چـــیا
  ناهێـــــــلی قلـــــەك گـــیا

  مەکینەی سەر تاشین

- بـــــــەرزە وەك چـــــــنار
  شـــــــیرنە وەك هـــــــەنار

  ( دار هەنجیر )

- بەســـــەد بـــرایان مـــێزەرەك

  ( گەسک )

- بەشــــەو خـــانم و خەندانـــــە
  بـە رۆژ لـە بـن دەسـت و پێـیانە

  فانۆس

- بــــە ســــەدو یــــەك بــــرا
  ریخەلۆکێکـــــــیان هەیـــــــە

  تەسبێح

- بـە سـێ برایان مێزەرێکیان هەیە

  فەرشە

■ بە هاوین و بەزستان
لێ ی دەدەن بە کۆڵە مستان

هەویر لە کاتی شێلان

■ بە هاوین پۆشتەو پەرداخ
بە زستان ڕووت و ڕەجاڵ

دارو درەخت

■ بەردەو بەرد نی‌یە،
گیا خۆرەو کەر نی‌یە،
هێلکەی دەکا مریشک نی‌یە

کیسەڵ

■ برێنە ئاقر تەواوێ
سێی لی سێبەرێ
دووی لەبەر هەتاوێ

نوێژە فەرزەکانە لە شەوو رۆژێکدا

■ بێ ڕەنگە، بێ مەرگە، بێ دەنگە

هەوا ( با )

- بنی قوورە
  قەدی زەردە
  سەری زێڕە

(گەنم)، پێش دورێنە

- بیگری قیچکێکە
  بەری دەی دنیاێکە

چاو

- بنی ڕەشە، قیامەت
  سەری سۆرە، سەلامەت

تەندور

- بی تەڕ تاڵە
  لێو تەڕە دوونە

داری (بی)

- بنە دارەکە
  لەسەری گۆڕە پ‌نەکە
  لە سەرویش گۆپاڵەکە

تەشی

- بـــــەلای دابـــــڕۆی کفـــــرە
  ســــــەیری بکـــــەی کفـــــرە
  بیـــــــبڕی کفـــــــــرە

  (دار کفر)

- بـــــە ئێشــــەو بـــــە مێشـــــە
  بـــــە فــــــەقیو دەروێشـــــــە
  وە قونـــــپانی لـــــــە پێشـــــە

  (شێرە کلۆ)

- بڵــــــندە وەك و حوشـــــــتر
  شـــــیرنە وەك و شـــــــەکر

  (دار توو)

- بـــــەر خــــــەت خـــــەتێ
  پشــــــت خـــــــیوەتێ

  (کوارك) قارچك

- بـــــە ســــــاردی شــــــلە
  بەگـــــــەرمی تونـــــــدە

  (هێلکە)

■ بـــــــــیری بـــــــــەردە
کۆڵـــــــــــــــــــی دارە
خواردنـــــــــی گـــــــیایە

(قەنەای جگەرە کێشان

■ بەســـــەرمایێ رووت دەکـــــرێ
بەگـــــەرمایێ جـــــل دەکـــــرێ

(اسێلی تان کردن اساج

■ بــە ١٢ بــرا ســێ دڵــیان هەیــە

(کاتژمێر)

■ بـــــێ لاق و بـــــێ بـــــارە
لـــــە راکردنـــــیش بـــــە غـــــارە
هـــــێلکەش دەکـــــات مـــــارە

مار

# پیتی (ت)

- تەخــــــتی شــــــین
پاشـــــــای زێـــــــڕین

ئاسمان

- تـــــەپ لەســـــەر تـــــەپ
دەســــــت لەســــــەر ڕەپ

دەستار

- تاقـــــــە ســــــــوارێك،
ســـــەد ســـــوار دەبەزێـــــنێ

کەرکید

- تـــــــــولی شــــــــین
تولـــــــبەندی شـــــین
دامکوتـــــا لـــــە مـــێرگی شـــین

(شوتی) شفتی

- تاقـــــــە ســـــــوار
دام لـــــــــە دیـــــــوار
بـــــوو بـــــە هـــــەزار

هەنار

■ تـــا کـــەرم بەســـتەوە،

جاشــك بەســەر بــانی کــەوت



ئاشی ئاو (قۆنەرە)

گۆمەشین ۲۰۰۲

# پیتی (د)

- دەســـــتاڕێ لـــــــە لـــیژی

دوتگی مەڕ

- دەچـــێتە ســـەری چـــیاو نـــاڕوا

ڕێگا

- دەمـی هەیە خواردنی پێ ناخوات

کۆرپە لەسکی دایکیدا

- دوو ئـــاو لـــــە جـــامـــێ
هــــــەر یـــــەك لـــــە رەنـگـــێ

هێلکە

- داك ئـــــاو ، بـــــاب خـــــۆر
کــــــورِ وەك خەپـــــە تـــــۆر

دومبەڵان

- دەڕوات پێی نیيە، جێ پێشی دیارە

دەرزی دورمان

■ دوو بان و دوو دوکان
هەشت مەڕو دوو بەران

دەست و پەنجەکان

■ دەچێتە جێیەکی بە موو
دێتە دەری ئاو لە دوو

کلچوک

■ داسوولکێ ئاسنۆکە
لە شەپکی دارۆکە

تەشی

■ داسۆلکێ خاران
کەوتە پشت ماران

سنگی رەشماڵ

■ دەمی نییە دانی هەیە

شانە

■ داك مردی باب مردی
فەرخۆکەی سەر پێ کردی

کاریتەو شەقرە

- دەســــــــــــــــکی دارە
  مـــــــــلی خـــــــوارە
  دەمـــــــــی هـــــــارە

داس

- دەســــتی پــــێ دادەیــــنی،
  دەمــــــی لــــێك دەکاتـــــەوە

مقەس

- دارەکــــم هەیـــــە لـــــە داران
  دەنگــی دێ وەك بــزن و کـــاران

زورنا

- دەیبەســـــــــــــتیەوە دەڕوا
  نایبەســـــــتیەوە نـــــاڕوا

پێڵاوی بەقەیتان

- دار لـــــــــــــــــــــە دارە
  ســــــــەری بــــــــزمارە
  بـــــــەنی هەوســــــــارە

تەشی

- دووە نـــــــابێ بەســـــــێ

شەوو رۆژ

- دەیکـــــــرِی رەشــــــــە
بــــــەکاری دێـــــنی ســـــۆرە
دەی رِێــــــژِی بــــــــۆرە

(رەژوو) خەڵوز

- دوو بــــــــــــــــــــەزەقی
دوو بــــــــــــــــــــەرِەقی
چــــــــوار دەچـــــــــەقی
دوو دەلــــــــــــــــــەقی

بزن

- دەبیبیـــــنی لەبـــــەری ناکـــــەی
نابیبیـــــنی لەبـــــەری دەکـــــەی

کفن

# پیتی (ز)

■ زەردی، زەردی
لــــــــە بــــــن بــــــەردی
حوکمـــــــــــــــــی ڕۆژێ
زراوی بـــــــــــــــردی

دوو پشک

■ زەردی، زەردان
لــــــــە بــــــن بــــــەردان
وەکـــــــــــی مـــــــــــەردان

دوو پشک

# پیتی (ژ)

■ ژێـــــــری ئاگـــــــــره

ســـــــەری ئـــــــاوە

ســـــــکی خەزێـــــــنەیە

سەماوەر



تاڤگەی باوەلاس

گزمەشین ۲۰۰۲

## پیتی (س)

■ سوارێمە سوارۆکە
لەسەر مایینێ دارۆکە
دەکاتن غار غارۆکە

مندالْ لەناو لانکدا

■ سەر ئاگرینە بن دارینە
خواردنێ وی گیایێ شینە

قەننە

■ سێ بەی
سێ زەرد بەی
سێ گولْ هەنار
سێ ژەهری مار

چوار وەرزی سالْ

■ سێ ماین هات بە پەلە
رەش ئەسمەریان لە گەرە
کلک درێژ کارە کەرە

سێ کوچکەو مەنجەلْ و کەوگیر

■ ســــــــپیە وەك كەشـــــــــك
دوو گــوێی هەیـــە وەك مشـــك

چەق چەقە، شەیتۆکە

■ ســــــــەری هـــــــــارە
پشــــــــــتی کـــــــــارە
ســــــــینگ بەرخـــــــــە
کلـــــــــك مقەســــــــە

پەرەسێلکە

■ ســــەڵتەی ســـــۆرە قورمـــزی
کونـــــی نیـــە ئـــاوی دەدزی

تەماتە

■ ســــەری ســــەوزە لەشـــی رەش
نـــــاوی ســـپیەو گـــــەش

باینجان

■ ســــــــەری چـــــــــیایە
بـــــــــنی گـــــــــیایە
ئـــــەوە چــــیە؟ چـــــرایە

چرا

- ســــــــوارێمە بەنیشـــــــــانە
لـــە ســـەر مایـــنێ بـــێ گـــیانە

کۆرپە لەناو لانکدا

- ســێ بــرا هــەن شەو ڕۆژ ڕادەکەن
هــەنگاوی گــەورەو بچوك دەبــەن
لــە ئەنجامــیش وەك یــەك دەبــن

میلەکانی (کاتژمێر)

- ســــــەیدی ســــــەر ســــــۆر

سلّقە سوور

- ســـــــــپی ســـــــــێ لاق

(فەرشە) خوانە

- ســـەری ســپی‌یە، نــاوی شــیرینە

پیرە ژنێکی ناو شیرین

- سـەد سـوار لـە دوای سوارەکی دەبەزی

تەسبێح

- ســەری بــۆ تــۆ، بــنی بــۆ کــەرێ

دەغڵ

- سـەری جاحـێرە، بـنی پـیرە
زەمـانی نـوری سـەعیدی لـە بیرە

فانۆس

- سـەر جـلی بـن جـل خـوری ١

کەڵاش

- سـی ژوری ئـیعدامە
ئـەو نانـەی دەی خـوات حەرامـە

تەڵەی مشک

- سـەری ئاگـرە
بـنی ئـاوە
نـاوەندی گـیایە

جگەرە لە کاتی کێشاندا

- سـەر هێسـک
بـەدەن ناسـک
چـوار گوێکـی بـێ پێچـک

هێلکەی چەق چەقە

- سندوقی سەرانە
لە ڕێی گۆڕستانە
من و تۆی میوانە

داره بازه

- سندوقی سولەیمانی
لە گۆڕەکی پانی

داره بازه

- سواری کەس نەبەزاندی
لانکی کەس نەژاندی
باخی کەس نەچاندی

گۆڕ

- سێیە، نابێ بە چوار

تەڵاق

## پیتی ( ش )

- شتێکم دیت لەدەشتێ
چار لە حاردی، دوو لە تەنیشتێ
غارمدا نەیگەیشتمێ

( سوار لەکاتی غاردان )

# پیتی (خ)

- خـــاتوون خـــانی ســـەر کورســـی
  ســـــــەری پـــــڕە لـــــە دەرزی

کەنگر

- خـــــــــانوی تـــــــــــاریك
  پــڕە لــە عەســکەری مــل بــاریك

شارە مێرو

- خاڵەکـــەم هەیـــە لـــە دەشـــتێ
  ســـەری گەورەتـــرە لـــە پشـــتێ

مێروستان

# پیتی (ق)

- قشـــتیلەی ســـەر بەســـتیلە

گەسک

- قســـە دەکـــات، دەمـــی نیـــە

قەڵەم

- قەسـری سـپی، سـواندە کەسـک

تەرەپیاز

- قونـــــدەی، بـــــێ مـــــوو

بۆق

- قەسـری سـپی، دەمانچـە لەسـەر

قاپە برنج و رانە گۆشت

- قـــــــەڵاتی گۆشـــــــتین
قادرمـــــــەی ئاســـــــنین

ئەسپ و زین

- قەســـری ســـپی بـــێ دەرکـــە

هێلکە

## پیتی (ک)

■ کـلاوی هەمـزە پاڵـەوان
بـێ تەقـەڵ و بـێ درومـان

(هێلکە)

■ کـارەکم بـەردا سـەر چـیایەکی
نەیهێشـت کـەرە گـیایەکی

(مەکینەی سەر تاشین)

■ کە بەکاری دێنی، فرمێسک دەڕێژی

(مۆم)

■ کـەری رەش، کورتـانی سـپی

(سێڵ و نان)

■ کانۆکانـە، کانۆکانـە
هەرچـی نەیـزانێ نەزانـە

(کانۆک)

■ کـەری مـردی
بـاری زنـدی

(لاتک و کۆرپە)

■ کچـــــــە پاشـــــــایە
بیســـت کراســـی لەبـــەر دایـــە

*کەلەم*

■ کـــاتێ ســـــەری دەبـــڕی
لـــــــــۆی دەگـــــــــری

*پیاز*

■ کـــارە قوتـــــەی مەلایـــــە
بـــــەرم دایـــــە چـــیایە
نەیهێشـــــت قلـــــەك گـــیایە

*مەکینەی سەر تاشین*

■ کە دەچێتە دەشت رووی لەماڵە
کەدەگەڕێتەوە رووی لە دەشتە

*(شاخی بزن) قۆچی بزن*

■ کـــــــــوڕی کوڕمـــــــــە
بـــــــــرای مـــــــێردمە

*لەدوو کور ژن بە ژنیان بە داپکیان کردبێ ژنێکیان بە کورەزاکەی بڵێت!*

■ کۆتکـــــــــە دارێکـــــــــە
دادگـــــــــەری شـــــــارێکە

*قەنەفە*

- کانی نییە، ئاوو دەدا
  زەویش قوت دەدا
  (چاو)

- کۆترێك هات بە هانە هان
  شاقەڵ سپی مل بەکەوان
  (مانگ)

- کوشتمەوەو خوێنی نییە
  کەورم کرت چەرمی نییە
  (قرژاڵ)

- کەپرەکم هەیە کەپرۆکێ
  لێی دەبارێ بەفرۆکێ
  (هێرەگ)

- کەری شین
  کەریەندی شین
  دام کوتا لە مێرگی شین
  (شووتی)

- کە لەدایك دەبێ، کلکی هەیە لاقی نییە
  کە گەورە دەبێ، لاقی هەیە کلکی نییە
  (بۆق)

# پیتی (گ)

■ گــــا گـــــێڕەوەیە،
بـــا گـــێڕەوەنیە
چێغ

■ گلـــۆرەی بایـــــە
تـــێم هەردایـــــە
قـــەد نەبـــڕایە
ڕێگا

■ گاڕانـــەکی پـــێوە دەچـــێ
پەنجـەی مـرۆڤی پـێوە ناچـێ
مێرو
کونی شارە

■ گـــەرۆکی نـــاو مـــالان
کلـــك درێژتـــرە لـــە دانـان
دوو پشك

■ گـــەردەن کۆتـــرێ
لە ناو دەغران دەکاتن لۆندرێ
داس

- گۆشتی لەدەر پیستی لە ناو
  بەردی مەڕ مەڕ دەکا بە ئاو

سێقە دۆڕە

- گایان کوشتەوە پایزێ
  کەوڵی کرد بەهارێ

زێنگی ناو بەهار کەوڵی کرد

- گای سوورەی حەوت چەرم
  لۆی گریای بە بێ شەرم

پیاز لە کاتی هورد کردنیدا

## پیتی (لام)

- لـــەو بـــانی لـــۆ ئـــەو بـــانی
نـــە پـــێ ی هەیـــەو نـــە پـــانی
بـــە هـــەموو مـــالآن دەزانـــی

دوکەڵ

- لـــە شـــەکری شـــیرین تـــرە
لـــە زێـــڕی بـــە نـــرخ تـــرە
لـــە ئاســـنی قورســـترە

خەو

- لـــە بـــنی گلیـــنە
لـــە نـــاوەندی گیاییـــنە
لـــە ســـەری زێڕیـــنە

ڕووەکی گەنم

- لانکـــی ڕانـــەژاو
بـــەرخی نـــەزاو
مـــەلای نەبـــەزاو

گۆڕ

- لە تەیراوەی دەست پێ دەکات
لـــە قـــەلات کۆتـــایی پـــێ دێـــت

پیتی ـ ت ـ

■ لـە سـبەینێ هـەتا ئـێوارە خۆڵـی
بەسـەر خۆی دادەکات کە ئێوارە
گەڕایـەوە مـاڵێ لـە کابـانی مـاڵێ
جوانترو خاوێنترە

گاسنی جووت

■ لــــــە دەوری پێغەمـــــــبەری
کلـــك لـــە تـــەوقی ســـەری

کودوی زەرد

■ لـــە ئـــاو دروســـت دەبێـــت
بـــە ئـــاویش کۆتـــایی دێـــت

خوێ

■ لــــــە نــــــیوەی پــــــڕە
بــــــە پــــــڕی نــــــیوەیە

مانگ

■ لـــە ئاسمـــان گـــەمان دەکـــا
بـە دەســـت و پـــێ ســـەما دەکـــا
خواردنـــی پاشـــا پـــەیدا دەکـــا

هەنگ

## پیتی م

دەستار

- مەیلەکم هەیە مەیلانی
  نەپێ ی هەیە نەپانی
  بە هەموو مالآن دەزانی

گوێزی هیندی

- مەیلەکم هەیە لە ناو مەیلان
  شیری هەیە وەك بزنان
  نە گۆی هەیە نە گوان

کەڵەشێر

- مەیلکم هەیە مەیلانی
  حەوت پیتە ئەگەر بزانی
  هەڵم دەستێنێ لە بەیان
  خودام لێ ناکاتن نیگەران

رەشکەی کاکێشان

- مەیلەکم هەیە لە دەشتێ
  حەفسەد کونی لە پشتێ

- مایـــنیٚ ســـپی چـــەپەرخانە
  خـــۆش خـــۆش دیٚ بەرمەیدانـــە

  (پارە)

- مـــەرە کـــەرەی بـــن گـــەوەریٚ
  هەڵدەپـــــەریٚ و نالـــــەوەریٚ

  (بۆق)

- مەیلـــەکم هەیـــە لـــەناو مـــەیلان
  وا لەدەشـــــــــــــت و دەران
  رەشـــــــە وەك بـــــــزنان
  بـــــەکارە بـــــۆ کـــــا کێشـــــان

  (رەشکەی کاکێشان)

- مریشـکێکمان هەیـە ١٢ هـێلکەی دەکات
  هـەر هـێلکەی ٣٠ جوجکـەی هەڵدێـنیٚ

  (ساڵ ومانگ وڕۆژ)

- مـیحرابی گۆشــتە مـزگەوتی ئـاوە
  روو لـە هەر لا بکات قیبلەی تەواوە

  (حەزرەتی یونس لە ناو سکی ماسیدا)

- مەیلـــــەکم هەیـــە مـــــەیلانیٚ
  لـــە نـــاو بوخچـــەی ســـوڵتانیٚ
  خـــودا نـــەبیٚ کـــەس نـــازانیٚ

  کۆرپە لەسکی دایکیدا

- مـــــاڵی ئەحمـــــەد پاشـــــایە
  بـــە بـــیٚ پەنجـــەرەو دەرگایـــە

  هێلکە

- مامـــەکم هەیـــە لـــە نـــیو گڵـــی
  بـــە سمـــێڵاَن دەلـــیٚ ووری ووری

  جورج

- مردوو زیندوو لە باوەش دەگریٚ

  لانک

- مردی زندی رادەکێشێتە کەندی

  مرۆڤ لە کاتی تەنگاویدا

- مالێك هەیە لە نێو مالآن
خۆشتر لە ماڵی خالآن
هەر کەسێ بێتە میوان
وەك مردوی بێ گیان

خەو

- مەڕی خالآن، لە پشت مالآن
نە دەدۆشرێ، نەدەفرۆشرێ

مێروولە

- مەنجەڵی جەفتێ
قوڵپەی کەتێ
کەس نەیگەیشتێ

تفەنگ

- مامەکم هەیە لە دەشتێ
کەچە سێڵەکی لە پشتێ

کێسەڵ

- مامەکم هەیە لە دەشتێ
کەلە خەنجەری لە پشتێ

دووپشک

- مامـــەكم هەيـــە لـــە زورگـــی
  ســـەلكی گەرەتـــرە لـــە وورگـــی

مێرووله

- ملی هەیەو سەری نی‌یە

كراس

# پیتی ن

- نـــــه ئاشـــــه، نەباراشـــــه
دەنـــــك دەنكـــــی، خاشـــــه
بـــــیخۆی و نـــــەخۆی ماشـــــه
ئەگـــــەر بـــــیزانی باشـــــه

ماش

- نـــــه داره، نـــــــــەدیواره
پـــێچ پێچـــەی چـــل هـــەزاره
لـــۆ كەپـــرەو لـــۆ رەشمـــاره

جنخ

- نـه لەسـەر زەویـەو نەلە ئاسمانه
نـه لەسـه زێـیەو نەلـه بـن زێـیه
دەخـواو دەخواتـەوه لـە ژیانـه

گۆزیە لە سکی دایكیدا

- نـــــه داره، نـــــــــەدیواره
پـــێچ پێچـــی، ســـەد هـــەزاره

رووبار

- نە بایە، نە باران
  چکە چکەی، درۆپان

کوندەڵان

- نە دارە، نە دیوارە
  بەنی، هەوسارە

تەم.

- نە کەندە، نە لەندە
  کەندو لەندە
  بەکەندێوە بەندە
  بزانە چییەو چەندە؟

دەم و زمان

# پیتی چ

- چـوارى لاقــە، هەشــتى گوێــیە
جــۆ نـــەخۆرەی بـــاری لێـیـــە

هەرزارە

- چـــومە ســـــەر گـــــردەکی
روانــــــــیمە بەحـــــــرەکی
هـــەر ماســـی لـــە رەنگـــەکی

ماقور لە کاتی
دروست کردندا

- چـــومە دیوەخـــانی مـــیر
پرســیارم کــرد لــە پــیاوی پــیر
چـــــیە تەیـــری بەشـــیر

شەمشەمە کوێرە

- چـوارى پێـیـە، هەشـتی گوێـیـە
بـــاری حوشـــترەکی، لێـیــــە

هەرزارە

- چـــومە ســـــەر چـــیایەکی،
دوو ئـــەشکـــەوتـــی تـــێـــدا

الوتا
کەپوو

- چـــــــواری چـــــێرێ
هەشـــــــــتی دێـــــــرێ
دووی مـــــــەڕە کوێـــــــرێ

گوان

- دەچـــێتە ســـەر چـــیاو نـــاڕوا

ڕێگا

- چـــومە ســـــەر چـــــیایەکی
لێی شـــین بـــبوو دەغڵـــی ڕەش

قژ (پرچ و سەر)

- چـــومە ســـــەر دارەکـــــی،
ڕوانــــــیمە ماڵـــــــەکی،
پـــڕ بـــوو لـــە بوکـــی ســـاڵەکی

بوکانە کوڕیکە

- چـــــــــەند دەوران دەورێ
دوو ئـــــــاوی جـــــامێ
نـــــەباریوە لـــــە هـــــەورێ

هێلکە

- چومە سەربانەکی
  روانیمە چیایەکی

  دەهات دەنگی
  شێرە سوارەکی

  *هەور*

- چوارە نابێ بە پێنج

  *وەرزەکانی ساڵ*

- چوار سوار هەن لە جۆمەکی
  تیران داوێنە گۆمەکی

  *گوانی چێڵ، لە کاتی دۆشیندا*

- چل نارە
  چل بزمارە
  چل چلۆکەی هەزارە

  *ئەستێرک*

- چل تاق، چل نیو تاق
  تێیدایە چاو زەقی، چاو زاق

  *هەنار*

■ چــــومە ســــــەر گــــــردەکی
فیـــــتەم کـــرد لـــــە شـــــوانەکی
سـی و حـەوت بەران لە نەوعەکی

ئەنگوتک (هەنگلوتکا)

■ چـــــــیای ئەرزیـــــــــــــــە
مــــــــــوی بــــــــــزنی‌یە

رەشماڵ

■ چــــوار بـــــالّی دوو چــــاو
دوژمــــــــنی زەوی و هـــــــەتاو

ماسی

■ چـل سـوار لـە سەر حەوت ئاخوڕ
دامەزرێـــــــنە بـــــــە تـــــاقی

بە پیاوێکی ناو تاقی

# پیتی پ

- رەشێ لە نساری
هەر دەداتە کابانی

هێزەی روونی

- رەشە وەک مەلحون
لوسە وەک سابون

قالۆچە

- رۆڵەی شیرین و شەویلە
دایکی چورچ و چەویلە

دارمێو

- رایەڵی لە سپیلکی
تێوەردانی لە سورکی
بڕانەوەی لە شینکی

قەزوان

- رەشـــە بـــزن نیـیـــە
  جـــۆ دەخـــوات کـــەر نیـیـــە
  دیـــوار دەبـــڕی دز نیـیـــە

مێروڵە

- رەشـــە وەك قـــیر
  ســـپییە وەك شـــیر
  تـــیژە وەك تـــیر

حاجی لەق لەق

- رەشـتاڵەی حەلقـەی لـە گـوێ
  دێ بـە دێ مـاڵ بـە ماڵ دەگەڕێ

مەنجەڵی ساوار کوڵاندن

## پیتی ھ

- هـــەر دەپـــەڕی لاقـــی نیـیـــە
  ســـپی‌یە مـــووی پـــێوە نیـیـــە

(تەرزە (تەزرە))

- ئـــــەوەچـــی‌یـــە هـــەوڕۆکـــە
  لێی دی‌بـــــاریێ بەفـــــــرۆکە

(هێلکە)

- هـــــەتا نەیبەســـــتیەوە نـــــاڕوا

(پێڵاوی بەقەیتان)

- هەتا لێی دەکەیەوە گەورە تر دەبێت

(چاڵ)

- هـــــــەلۆ تـــــــرو مەلۆتـــــــــر
  ســـــەری قـــــازە، مـــــلی کۆتـــــر

(داس)

- هـەر چەند بیکێشی، کەم دەبێتەوە

(جگەرە لەکاتی کێشاندا)

- هەندی پشکە
  پڕی ڕشکە

  هەنجیر

- هاشان و ماشان
  لە جێی میرو پاشان

  لانك

- هەری دەی چیایە
  دایبنێی گایە

  ڕەشماڵ

- هرم کردە مەڕەکی
  سەد مەڕ هات لە ڕەنگەکی

  زەردەواڵە

- هەندوکە، مەندوکە
  تێیدا سەد مرواری بچوکە

  هەنار

- هەندی پیازێکە
  لە هەورازێکە

  هەنار

- هەتا بڕۆی لە دوتە

سێبەر

- هێلکەی قازان
لە هەورازان
کەوتە بازان

تەزرە

- هەڵمەت دەبات لۆ پێشێ
دەوی بەشەو ددانی نیيە بیکێشێ

مەشکە

- هەتەرۆک، مەتەرۆک
سەری بابت کەچەرۆک

جۆنی

- هەر لێرە، هەتا شارەزور
هەموو قەشەی ردێن سوور

(زەنگەزۆرە) زەنگەستوورە

- هەندوکە، بەدندوکە
لە پێش حاکمان دەڵێی بوکە

جرا

- هەر چەند غار بدات
  لە جێی خۆی ناڕوات

(قایشی ئاش) لە کاتی ئیشدا

- هەر چوار دەوری ئاوە
  ناوەندی تەندورە
  نازداری دیوەخان و ژوورە

سەماوەر

- مەشتەق، مەشتەق
  ئاسنی سەرزەق
  دای لە تەبەق

شەکر شکێن

- هێڕی هێڕی
  لە بن دەستی بێری

بزن

- هەندی هەنارێکە
  پڕ بە ماڵێکە

گلۆپ

- هەتا لێی نەخوری ناڕوا

مقەس

- هەندوکە بە دندوکە
دەخورێت بیزانە زووکە

دەنکی نۆک

- هەموو کەس دەپۆشێ
خۆی ناپۆشێ

مقەس

# پیتی ی

- یەکـــــــە نــــــابێ بـــــە دوو — خودا

- یـــــــەك پـــــــولی بچــــــوك،
ژورێکـــی گـــەورە پـــڕ دەکــات — کا

# پیتی پ

- پێـــنجە نـــابێ بـــە شـــەش

پێنج نوێژی فەرز لە یەک شەوو ڕۆژا

- پێـــنج مـــانگ بەحـــری یـــە
بـە خـۆی حاكمـە بـەرگی بوزیـە

برنج

- پـــێخەفەو پـــێخەف نی‌یـــە
پـــێی دادەن ئاگـــای لێ نی‌یـــە

باگوردان

- پاكی لـــەوێ كـــە وتـــووە
تـــەڕكـــی لـــەوێ كەوتووە

شوتی

- پـــیـــاوێك ئاوڕی لە ئافرەتێكی
نامەحرەم دایەوە، نەزەری لــێ
حـــەرام نـــەبـــوو؟

پیاوەكە كوێ بوو

## پیتی ف

- فـــــــەخفوری تێـــــــیدا،
ئـــــــاوی دوو رەنـــــــگ

هێلکە

# مەتەڵی چیرۆك ئامێز

- دوو كـەس لـە خاڵـێكی پشـكنین ڕەت بـوون، كەسـی یەكـەم كـە ڕەت بـوو لێـیان پرسـی: بـرات هەیـە؟ ووتـی: نەخـێر، لـە هـی دووەمـیان پرسـی بـرات هەیـە؟ ووتـی: بـەڵێ برام هەیە، ئەوەی پێشم برامە.

وەڵام (كەسی دووەم ئافرەت بوو، خوشكی كەسی یەكەم بوو، كە ئەویش پیاو بوو)

- پاشـایەك خـانوێكی شووشـە بـەندی هـەبوو، پاسـەوانێكی لـەناو بـوو، پاشـا شـەوانە دەرگای خانوەكەی كلیل دەداو كلـیلەكەی لەگـەڵ خـۆی دەبـرد، پاسـەوانەكەش لـە ژوورەوە بـوو، بەیانـیەك پاشـا چـووە لای خانوەكـەی بیـنی لایـەكی شووشـەی خانەكـەی شـكاوەو پاسـەوانەكەش ڕای كـردووەوماڵیشـی لێ دزراوە، پاشا زانی ئەو كارە پاسـەوانەكە ئـەنجامی نـەداوە، پاشـا چـۆن زانـی پاسـەوانەكەی ئـەو كـارەی نەكردووە؟

وەڵام: لەبەر ئەوەی شكاندنی جامەكە لەدەرەوە ئەنجام درابوو، پارچەكانی كەوتبوونە ژوورەوە شوێنی شكاندنەكە دیار بوو.

■ پیاوێك بە ڕێگادا چوو توشی کەسێك بوو، خەریکی بەرێ‌ێك بوو ووتی: ئەوە چی دەکەی؟ ووتی: ئەم بەردە گەورەیەم لە ناو ئەو ئەشکەوتە فڕێ داوەتە دەرەوە، ئێستاش هەوڵ دەدەم بۆم ناچێتەوە شوێنی خۆی، دەترسم لەبەر ئەو بەردە خوای گەورە بم سوتێنێ. ئەو کەسەی بە جێ هێشت، ئەم جارە تووشی کەسێکی تر بوو، کۆڵە پوشێکی گەورەی پێ بوو، دای نابوو ووتی: ئەوە چی دەکەی؟ ووتی: دەمەوێ ئەم کۆڵە پوشە بە پشتی خۆم دابدەم، بەڵام هەرچەند دەکەم ناتوانم و بۆم هەڵناگیرێ. پیاوەکە، ئەمیشی بە جێ هێشت ، تووشی باخەوانێك بوو ، گوڵ و میوەی زۆری داچاندبوو، وە دارەکانیش هاتبوونەبەر، لێی پرسی ئەوە چی دەکەی؟ ووتی: ئەوە ڕەنجی ماندوو بوونی خۆمە، چاوەڕێی بەرهەمەکەی دەکەم و دەمەوێ بەرو بومەکەی لێ بکەمەوەو بیخۆم، پیاوەکە ئەمیشی بە جێ هێشت و ڕۆیشت.

(ئەم سێ کەسە کێ بوون؟)

وەڵام: (کەسی یەکەم بوختانی کردبوو، بۆی نەدەچووەوە شوێنی خۆی، ئەو قسەی لە دەمی دەرچوبوو بۆی نەدەچووەوە ناو دەمی، کەسی دووەم: بەدوای دنیا کەوتبوو، دەی ویست هەموو دنیا بە کوڵی خۆی دا بدات بۆی نەدەکرا. کەسی سێیەم: پیاوێکی خوپەرست و زۆر چاکە کار بوو، کردەوەکانی جوان بوون، چاوەڕوان بوو پاداشت لە خوا وەربگرێتەوە لە بەهەشت)

فەرهاد گۆمەشینی




# لغز الكوردية

# Mail, Mailaniy Kurdawary

Kokerdnawaw Amadakrdni

**Farhad Gomashiny**

نرخی ١٠٠٠ دیناره

ژمارەی سپاردن
٩٠